# نزايەك

بسم الله الرحمن الرحيم

يا الله، يا رحمن، يارحيم، يا فرد، يا حي، يا قيوم، يا حكم، يا عدل، يا قدوس!

تو حەققی ئیسمی ئەعزەم و حورمەتی قورئانی خاوەن ئیعجازی بەیان و ڕێزی پێغەمبەری ئەکرەم، صلی الله علیه وسلم: هەموو ئەو کەسانەی کە ئەم کۆمەڵە پەیامەیان بە چاپ گەیاندووە و یارمەتیدەرە بەڕێزەکانیشیان بە بەهەشتی فیردەوس و بەختەوەریی هەمیشەیی شاد بفەرموو. ئامین..

هەمیشە و بەردەوام لە خزمەتی ئیمان و قورئاندا تەوفیقیان بدە. ئامین..

لە بەرامبەر هەر پیتێکی کتێبی (وتەکان)ەوە هەزار کردەوەی چاك لە لاپەڕەی کردەوە چاکەکانیاندا بنووسە. ئامین..

بە فەزڵ و میهرەبانیی خۆت دامەزراوی و بەردەوامییان لە بڵاوکردنەوەی پەیامەکانی نووردا پێببەخشە. ئامین..

یا ارحم الراحمین! سەرجەمی قوتابییانی پەیامەکانی نوور لە هەردوودنیادا بەختەوەر بفەرموو. ئامین..

لە شەڕی شەیتانەکانی ئینسو جیننی بیانپارێزە. ئامین..

لە قسوور و گوناهەکانی ئەم "سەعید"ە دەستەوسان و بێچارەیەش خۆش ببە. ئامین.

